



ناوی کتێب: هاوسەنگیی لە ژیانی موسوڵماندا

نووسینی: د.عبدالکریم بکار

وەرگێڕانی: بەهجەت جەمیل حامد

پێداچوونەوەی: بەهرە محمد علی

نۆرەی چاپ: یەکەم – ٢٠١٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٠٥٦)ی ساڵی (٢٠١٥) ی پێ دراوە

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودا، سەلاّت و سـەلام لـە سـەر پێغەمبـەری خودا..

خوای گەورە مرۆڤـی لـە جـوانترین شـێوەدا دروسـتکردووە، بـەلاّم کاتێـك ئـەم مرۆڤـە ئامـانجی ڕوونـی نابێـت و، دۆخـی لـەباری بـۆ نارەخسـێت تـا پارێزگـاری لـەو جـوانترین شـێوەیە بكـات، تەماشـا دەكەیت دووچاری ناهاوسەنگی و نادادی دەبێت.

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّـهَ يَـأْمُرُ بِالْعَـدْلِ وَالإِحْسَـانِ..﴾[1] (بەڕاستی خودا ئەمرتان پیێ دەكات بە میانـەڕەوی وەك خـودا بەیـەك زانـین و بەخشـندەییو دادپـەروەرییو خوداپەرسـتیو، ئـەمرتان پـێ دەكـات بـە چـاكەكردن بـە جـۆرێ كـە وابـزانن خـودا لـە بەرچـاوتانەو دەتانبینێ.) النحل: ٩٠

---

١- واتای ئایەتەكانی نێـو ئـەم پەرتووكـە لـە تەفسیری (خولاسـەی نـامی)یـەوە وەرگێراوە.

پێغەمبەری نازداریشمان (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ژیانیدا ئەو هاوسەنگییەی پیادە کردووە و، هاوەڵانیش (خوا لێیان ڕازی بێت) لە ژیانیاندا پەیڕەوییان کردووە:

هاوسەنگبوون لە قسە و گوفتاریاندا: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ..﴾ (ئەگەر لە مەحکەمەدا شایەتیتان داو قسەیەکتان کرد ڕاستگۆ بن) الأنعام: ١٥٢

هاوسەنگبوون لە بڕیاردان و فەرمانڕەوایەتییاندا: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ..﴾ (خودا ئەمرتان پێ دەکات کە کاتێ داوەریتان کرد لە بەینی خەڵکدا بە دادو هەق حوکم بکەن و، لایەنی یەکێکیان مەگرن لەسەر حیسابی لایەکی تر.) النساء: ٥٨

هاوسەنگبوون لە هەست و سۆز و مامەڵەیاندا: ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى..﴾ (یا ڕق و قینتان لە کافرەکان واتان لێ نەکات بە ناڕاستیو ناعادلانە بجوولێنەوە لەگەڵیان و دەسدرێژییان لێ بکەن: دادپەروەرو حەق گۆو حەق کردار بن. دادو ڕاستی نزیکترتان ئەکاتەوە لە گوناه نەکردن و لەخوداترسان.) المائدة: ٨

کەواتە هاوسەنگبوون بەرجەستەکردنی دادپەروەرییە لە کەسایەتی موسوڵماندا، چونکە هاوسەنگییەکە لە نێوان خواستی گیان و جەستە و، دونیا و دوارۆژ و، سۆز و ڕەمەکەکانیدایە[1].

ئـەم هاوســەنگییە سەرسـوڕهێنەرەش لـە فەرمایشـتی خـوای گەورەدا ئاماژەی بۆ کـراوە: ﴿وَابْتَـغِ فِيمَـا آتَـاكَ اللَّـهُ الـدَّارَ الآخِـرَةَ وَلا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا..﴾ (لەو ماڵی دنیایەدا کە خوا پێی بەخشیوی لەدووی ماڵی قیامەتیشت بگەڕێ واتە: خێرو چاکە بۆ ئـەو دنیایشـت پاشـەکەوت بکـەو بەشـی ژیـانی ئـەو دنیایەیشـت لەیادنەچـێ کـە بەخۆشی بژیت) القصص: ٧٧

مرۆڤ سەرچاوە و بنەڕەتی هەموو ژیار و شارستانیەتێکە؛ هەر بۆیە هاوسـەنگییەکەی ئـەو شارسـتانیەتییەی بـۆ مسـۆگەر دەکـات کـە خەریکی بنیاتنانیەتی.

خوای گەورە ئایینی بۆ تـەواو کـردین و بەخششـی خـۆی بەسـەردا ڕژاندین: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْـتُ عَلَـيْكُمْ نِعْمَتِـي..﴾ (ئـەمڕۆ ئـاییینم بـۆ تـەواوکردن و ئایەتـەکانم هـەموو بـۆ نـاردن و، ڕێوشـوێنی ئـاییینی ئیسـلامتان بـۆ ڕوون بوویـەوە و نیعمـەتی خـۆمم ڕژانـد بەسەرتاندا...) المائدة: ٣

---

١- ڕەمەك: غريزة

یـەکێك لـە واتاکـانی (کمـال)یش هاوسـەنگیکردنە.. بۆیـە هـەر بانگەوازێك بۆ پابەندبوون بەم ئایینەوە و، هـەر وشـە و هـەنگاوێکیش کـە ببێتـە مایـەی هیدایـەت و شوێنکەوتنیشـی خێـری پێوەیـە و، پێویستە لەسەرمان ڕێزی لێ بنێین؛ تاوەکو کۆشکی ئەو شارستانیەتە لەسەر بنەڕەتێکی قایم و هاوسەنگ بنیات بنێین.

لە پاڵنەرەکانی ڕابوونی هاوچەرخیش بوونی ئەم جـۆرە نووسـراوە جوان و ناوازانەیە کە ڕێگە خۆش دەکات و، ئامانجـەکان دیاریـدەکات و، ڕەفتاری جوانی لێدەکەوێتەوە.

سوپاس بۆ خواش کە ئەمڕۆ لـە گۆڕەپـانی ڕۆشـنبیریدا نووسـراو و بەرهەمی بەپێز لە زیادبووندایە، ئەمانەش ئاماژەیەکی دڵخۆشـکەرن و ئومێدی هەڵهاتنی ڕۆژێکی نوێ بە ئوممەتەکەمان دەبەخشن.

زۆر سوپاسی دکتۆر (عبدالکریم بکار)یش دەکەم لەسـەر نووسـینی ئەم بابەتە ناوازانە، کە بوونەتە توێشوو بۆ هەموو تاکێکی هۆشیار..

لە خوای گەورە داواکارین سەرکەوتووی بکات..

محمد عدنان السقا

# پێشەکی
## بەڕێز دکتۆر عبدالکریم بکار



سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان، درووود و سەلام لەسەر پێغەمبەر و یار و یاوەرانی بەگشتی...

سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی هەنووکە خەریکە هۆشیارییەکی نوێ دەربارەی گرنگیی پەروەردە لە زۆربەی شوێن و ژینگە ئیسلامییەکاندا ـ گەر نەڵێم هەمووشیان ـ سەر هەڵدەدات. خەڵك بەرەبەرە وا خەریکە هەست بە بەهای تاك و بەهای ئاڕاستەکردن و ڕێنماییکردنی دەکەن.

لەوەش گرنگتر لەبەرچاوگرتنی بایەخی شارەزایی پەروەردەییە لە سەرکەوتنی خێزان و لەو ئەرك و ڕۆڵە مەزنەی کە لە پەروەردەکردندا دەیگێڕێت. سوپاس بۆ خوا بۆ زۆربەمان دەرکەوتووە کە پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانمان لەسەر هەمان ئەو شێوازەی کە ئێمەی

لەسەر پەروەردە دەكرا كەموكوڕی و زیانی زۆری لێدەكەوێتەوە، ئەمەش مایەی خۆشحاڵییە بۆمان.

ئەو گۆڕانكارییە خێرایانەی كە ڕوودەدەن، ناچارمان دەكەن بە چاوكراوەیی تەواوەوە مامەڵە بكەین و زۆر بەئاگا بین، بۆ ئەوەی ڕۆڵەكانمان لە دەست نەدەین، بێ ئەوەی بزانین چۆن و بەچ شێوەیەك ڕۆڵی ڕاستەقینەی پەروەردەیی خۆمان بگێڕین.

وای لێهاتووە كە منداڵ و لاو بتوانێت بە ئارەزووی خۆی سەرتاسەری جیهان لە میانەی پەنجەنان بە چەند دوگمەیەكدا بەسەر بكاتەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی:

- تێكەڵاوبوونی بابەتەكان لە زەین و بیریدا و، بەكەم سەیركردنی داب و نەریت و یاسا و ڕێساكانی نێو ژینگەكەی خۆی.
- هەڵسوكەوتی نابەجێی لەگەڵ دەوروبەردا لێدەكەوێتەوە، گەر بێتو چاودێرییەكی وردی نەكەین.

سوپاس و ستایشیش هەر بۆ خوای گەورەیە.

# دەسپێك

دروود و سڵاو بۆ سەر پێغەمبەرمان موحەممەد پێشەوای پێغەمبەران و دواپینی نێردراوان و، بۆ سەر یار و یاوەران و شوێنکەوتووانی تـا ڕۆژی دوایی..

ئومێدەوارم کاتێـك کـە بابەتگـەلێك دەخوێنینــەوە هەنـدێکیان تۆمـار بکەین، چونکە زانیارییەکان بە تۆمارکردن نەبێت بیردەچـنەوە، ئـەوەی لەم پەرتووکەدا بۆتانی باس دەکەم ڕەنگە شـتێکی نـوێ نـەبێت، بـەڵام دەمەوێت شتانێکتان وەبیر بهێنمەوە کـە دەشـێت لـە یادتـان چـووبێت، ئەو تێبینیانەشی کە مرۆڤ تۆماریان دەکات پێویستە دوای تۆمارکردنیان فریـان نـەدات و، ناشـبێت هـەڵیانبگرێت و نەچـێتەوە سـەریان، بـەڵکو دەبێت بگەڕێتەوە سـەریان و بـە وردیـی لێیـان بکۆڵێتـەوە و سـەرنجیان بـدات و، بڵێـت: ئـەم قسـەیە بـۆ مـن، یـان بـۆ هەڵوێسـت و ڕەفتـار و کەسایەتی و تێگەیشتن و ئاگایی من چی دەگەیەنێت؟؟

بۆیە کاتێك دەگەڕێتەوە سەر ئەو تێبینـی و زانیارییانـە؛ مانـای وایـە پێی ناوەتە سەر ڕێی پێشکەوتن و پەرەپێدان.. واتـە ڕێـی پەرەپێـدانی خــود. بێگومــان ڕێگــەی پێشــکەوتن و پەرەپێـدان، ئــەوە نییــە کــە

گوێبیستبین و دواتر لەیادمان بچێت، بەڵکو ئەوەیە کە بیرۆکەی باش و پەسەندمان دەست بکەوێت و، هەوڵبدەین تێیدا قووڵببینەوە و بەباشی لێی تێبگەین و، پاشان وردببینەوە بزانین ئەم وشەیە و ئەم بیرۆکەیە لە ژیانماندا چی دەگەیەنێت و، چۆن بتوانین سوودی لێ ببینین لە دروستکردنی گۆڕانکاریی گەورە لە ژیانی کەسیی هەر یەکەماندا...؟

**هاوسەنگی** لە ژیانی موسوڵماندا، یان میانەڕەوی لە ژیانی موسوڵماندا.. لە ڕاستیدا هەر هەمووی باس و خواسی هەڵگری واتای جوان و لەیەکەوە نزیکن..

**هاوسەنگی** هەمیشە شتێکی جوان و پەسەند و خوازراوە و، ئەوەی ڕاستی بێت مرۆڤ سەرسام دەبێت و شانازی بەخۆیەوە دەکات کاتێك دەبینێت ئەو سیفەت و تایبەتمەندییانەی لەخۆیدا کۆبوونەتەوە لە کەسانی تردا تاك و تەرا و کەمن.

کەسێك کە سیفەتێکی جوان، یان دوو سیفەت، یان سێ سیفەتی تێدا کۆبووبێتەوە، مایەی خۆشحاڵییە، بەڵام نابێتە مایەی سەرسام بوون هەتا زۆرترین سیفەتی جوان و بەجێی تێدا کۆنەبێتەوە..

**ئێستا ئەم پرسیارە دەکەین:**

ئایا لە بنچینەدا ژیانی موسوڵمان دەبێت هاوسەنگ بێت یان لاسەنگ بێت..؟ ئایا ئەگەر مرۆڤ گوێ بەخۆی نەدات؛ کەسێکی هاوسەنگی لێ دەردەچێت..؟

**وەڵام:** نەخێر.. لە بنەڕەتدا دەبێت مرۆڤ هاوسەنگ نەبێت؛ چونکە هاوسەنگی پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشان و، هێز و، ژیریی و، پەروەردەکردنی دەروونە.

ئایا مرۆڤ لە بنەڕەتەوە دەبێت زانا بێت..؟

**وەڵام:** نەخێر.. لە بنەڕەتەوە دەبێت نەزان بێت مەگەر هەوڵ بدات و فێر ببێت[1]

**کەواتە** .. ئەو کاتە ناهاوسەنگی لە ژیانماندا دروست دەبێت گەر بێتو هەوڵی تەواو نەخەینەگەڕ تاوەکو هاوسەنگیی پێویست بەدەست بهێنین.

## چەند تێبینیەکی پێویست بۆ هەنگاونان بەرەو هاوسەنگی:

مرۆڤ لە کوێوە و لە چ چوارچێوەیەکەوە بۆ هاوسەنگی تێبکۆشێت..؟

من پێم وایە ئەگەر مرۆڤ بەباشی لە چەند باس و بابەتێك تێگەیشت، ئەوا دەتوانێت بڵێت: من ئێستا تا ڕاددەیەکی زۆر باش کەسێکی هاوسەنگم، یان هەنگاو بەرەو بەدەستهێنانی هاوسەنگی دەنێم.. لەو باس و بابەتانەش:

---

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (خودای گەورە ئێوەی لەسکی دایکتان دەرکردوە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەنەزانی. هەروەها هێزی بیستن و بینین و دڵی بۆ دروست کردون بەڵکو شوکرانەبژێریی خودا بکەن.) النحل:٧٨

## کاری یەکەم: مرۆڤ کار و ئەرکەکانی خۆی بزانێت..

ئەو مرۆڤەی کە بێئاگایە لە کار و ئەرکی خۆی هەرگیز ناتوانێت کەسێکی هاوسەنگ بێت.. گریمان کەسێك نە دەزانێت حەرام و قەدەغەکراوەکان چین و، نە ئاگایشی لە ڕەوشت و پایە و سوننەتەکانی ئیسلامە.. ئیدی ئەم کەسە چۆن کەسێکی هاوسەنگی لێ دەردەچێت؟!.

کەواتە.. لەسەر مرۆڤ پێویستە کار و ئەرکە شەرعیەکانی خۆی بزانێت، جا هەرکات ئەو ئەرکانەی زانی و بەگوێرەی توانا هەوڵی بەجێهێنانی دان، مانای وایە یەکێك لە فاکتەرەکانی هاوسەنگبوونی لە کەسایەتی خۆیدا بەدیهێناوە..

## کاری دووەم: مرۆڤ ئامانجەکانی دەستنیشان بکات..

ئەو مرۆڤەی کە ئامانجی هەیە ملی ڕێی هاوسەنگی گرتووەتەبەر.. ئەو کەسەی کە ئامانجی ڕوون و دیاریکراوی نییە کەسێکی خەسارۆمەندە.

ئاشکرایە گرنگترین سەرمایەی مرۆڤ کە تەمەنە بەبێ هوودە بەسەر دەچێت و، ڕێکخستنی کات زۆر بە ئەستەم دێتە کایەوە ئەگەر مرۆڤ ئامانجی ڕوون و دیاریکراوی نەبێت لە ژیاندا تا هەوڵی بۆ بدات..

وا دابنێ خوێندکارێك لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا گوێ بە دەرچوون نادات..!! هەموومان لە ڕۆژانی تاقیکردنەوەکاندا چاومان لێیە کە ژیانی ئەم خوێندکارە چەندە جیاواز و ناهاوسەنگە، بەوەی کە دەستی داوەتە

یـاریکردن بـە تـۆپ، یـان تەماشـاکردنی تەلـەفزیۆن، لـە کاتێکـدا خوێندکارەکانی هاورێی سەرقاڵی کۆششکردنن، سووریش دەزانێت کە سبەینێ تاقیکردنەوەیەکی قورسیان هەیە..!! دەڵێین: ئەمـە مرۆڤێکی ناتەواو و سەرلێشێواوە.. باشە چ شتێك سەری لێ شێواندووە..؟؟

ئەو نازانێت دەبێت ئەمرۆ چ کارێك بکات و، نازانێت ئـەو ئامانجەشـی کە پێویستە ئەمرۆ لە رێی کۆششکردنەوە بەدیی بهێنێت چییە، هەربۆیە ئەم کەسەمان بەلاوە کەسێکی نەفامە و، رەنگە بشڵێین تێکچووە..

ئێمە خەریکین مرۆڤێك تاوانبار دەکـەین لەسـەر ئـەوەی کـە ئامـانجی رۆژێك لە رۆژانی ناروون بووە، ئەی چی بەو کەسە بڵێین کـە ٦٠ یـان ٧٠ ساڵە ژیان دەگوزەرێنێت بەبێ ئەوەی بزانێت چ ئـەرکێکی لەسـەر شـانە کە پێی هەستێت.. پێویستە چ کارێك ئەنجام بدات.. پێویسـتە لەسـەری بگاتە کوێ..!!

ئیبن جەوزی[1](رەحمەتی خوای لێبێت) ئاماژە بە قسەیەکی زۆر جوان و سەرسورهێنەر دەکات کە بەڵگەیەکی روونە لەسەر نەگۆڕیی سروشـتی مرۆڤ، ئەو دەڵێـت: کەسی وا لەم سـەردەمەی ئێسـتاماندا بەدیـدەکرێت ئەگەر لێیشی بدەیت تاوەکو نوێژ بکات هەر نایکات، هـەر خـودی ئـەم کەسە ئەگەر قامچیشی لێ بـدەیت تـاوەکو رۆژووەکـەی بشـکێنێت لـە رەمەزاندا نایشکێنێت..!!

---

[1]- بڕوانە: صيد الخاطر، الانقياد للشرع لا إتباع العادات، ژمارە: ١٦٦

ئێمە دەستبەجێ دەڵێین: ئەمە سەرلێتێکچوونێکی گەورەیە.. چونکە نوێژ بە کۆی دەنگی زانایان لە ڕۆژوو گرنگترە و، مەزنترین پایەشە لە پایەکانی ئیسلام لە دوای شایەتومانەوە و، ڕۆژانەش دووبارە دەبێتەوە، کەچی ئەم کەسە ئەگەر تێی هەڵبدەیت و بە قامچیش لێی بدەیت نوێژ ناکات و، ئەگەر بە قامچیش لێی بدەیت تاوەکو ڕۆژووەکەی بشکێنێت ئەوا نایشکێنێت..! ئەمە بە هۆی هەڵە تێگەیشتنەوەیە لە ئەرکەکان.. بۆیە کاتێك کەسێك نازانێت ئەرکەکانی سەرشانی چین، ئیدی بەو چەشنە هەڵسوکەوت دەکات..

تا ئەمڕۆش لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا کەسانێك هەن ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەگرن و، زۆر بە تەنگ دروشمەکانیەوەن و، نەگرتنی بە ڕەفتارێکی نابەجێ سەیر دەکەن، کەچی نوێژ ناکەن..!!

خەڵکانێکی زۆریش لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا هەن سەریان بچێت نوێژی هەینییان ناچێت، کەچی نوێژە فەرزەکان ناکەن..!!

هەندێ کەس ئەوەی زۆر بەلاوە سەیرە، بەڵام ئەو حاڵەتە بوونی هەیە و، هەر کەسێکیش کە بە جیهانی ئیسلامیدا گوزەر بکات شتی زۆر سەرسوڕهێنەر لە کەسایەتی موسوڵماندا بەدیدەکات، لە ئاکامی بێئاگایی و تێنەگەیشتنی ئەرکەکانی.

## کاری سێیەم: زانینی سوننەت و ڕەوشتە جوانەکان..

سوننەت و ڕەوشتە جوانەکان مرۆڤ فێری ئەوە دەکەن چۆن مافی ئەقڵ و ئاوەزی بدات و، چۆن مافی ڕۆح و گیانی بدات، چۆن مافی کەسوکاری و، دراوسێکانی و، میوانەکانی و، هاوڕێ و برادەرەکانی و،... پێشێل نەکات.

تەواوی ئەو شتانە لە سوننەت و ڕەوشت و ئاکارە ئیسلامییەکانەوە فێر دەبێت.

## بایەخی سوننەت و ئاکارەکان

ئەوەی ڕاستی بێت سوننەت و ئاکارە جوانەکانیش فاکتەرێکی گرنگن لە پرسی هاوسەنگیی موسوڵماندا.

کۆمەڵگەی موسوڵمانیش کاتێك کە وابەستەی سوننەت و ڕەوشتی بەرز دەبێت، ئەو ڕەوشتبەرزییە سەرەتا هۆگرییەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵکیدا دێنێتە ئاراوە، ئەو هۆگرییەش لە میانەی لێکچوونەوە دروست دەبێت: لێکچوون لە ڕووکاردا.. لێکچوون لە بەجێهێناندا.. لە ئیشوکاردا.. لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاردا.. لە هەڵوێست و بڕیارداندا..

بۆیە هەمیشە لێکچوون هۆگریی و پێکەوە ژیان دێنێتە کایەوە..

کەوابوو سوننەت فاکتەری هۆگربوونی نێو موسوڵمانانە و، سەرەڕای ئەوەش قەرەبووی کەموکوڕییەکانی نێو فەرزەکانیش دەکاتەوە، سەرباری ڕۆڵبینینی وەك هێڵی پێشەوەی بەرگریی...

هەربۆیە ئەو موسوڵمانەی بۆ نموونە نوێژی چێشتەنگاو یان شەونوێژ دەکات، ئەوا شەیتان ناتوانێت زەفەری پێببات تا واز لە نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر بهێنێت.. بەڵکو سەرەتا زەفەری پێدەبات تا واز لە شەونوێژ بهێنێت؛ کەواتە ڕۆڵی هێڵی پێشەوەی بەرگری لە نوێژە فەرزەکان دەبینێت.

سوننەت سەرباری ئەو واتا جوانانەشی، وەك فاکتەری هاوسەنگی وایە لە ژیانی موسوڵماندا، بۆ نموونە موسوڵمان دەڵێت: سوننەت وایە سەردانی فڵانە برام بکەم.. سوننەت وایە بڕۆم بۆ گۆڕستان.. سوننەت وایە فڵانە نەخۆش بەسەر بکەمەوە.. سوننەت وایە وەها بکەم.. دەبینین کە چیتر کاتی خۆی بە تەنها شتێکەوە ناکوژێت، بەڵکو هەوڵ و کۆششی بۆ هەموو کارەکان چڕ دەکاتەوەو هیچ کامێکیان فەرامۆش ناکات..

کەوابوو فاکتەرێکە بۆ دابەشکردنی کات، فاکتەرێکە بۆ چڕکردنەوەی هەوڵ و تەقەلا، فاکتەرێکە بۆ بایەخدانی هەمەلایەنە بە زۆر شتی چاك و سوودبەخش، ئەو شتە چاکانەش دواجار دەبنە مایەی دروستبوونی کەسایەتییەکی مامناوەند و میانەڕەو.

سوننەت وەك ئاماژەمان پێدا فاکتەرێکی هاوسەنگییە لە ڕووە باش و ئەرێنییەکەیەوە، هەروەها فاکتەرێکی دیکەی هاوسەنگی هەیە لە ڕووە خراپ و نەرێنییەکەیەوە، کە بەڕای من تەواوکەری وێنەکەیە، تەواوکەری پرسی سوننەتەکەیە، ئەویش دوورکەوتنەوەیە لە زێدەڕەوی و،

دووركەوتنەوەیە لە توندڕەوی؛ واتە توندڕەویی نابەجێ، هەروەها جیاوازیش هەیە لە نێوان دەمارگیریی و پابەندبووندا..

توندڕەویی نابەجێ ئەوەیە مرۆڤ خۆی بخاتە ژێر بارێکی زیادەڕەوی نارەواوە کە ئیسلام داوای نەکردبێت، ئاشکراشە ئەو زیادەڕەویەی کە لە کارێکدا دەکرێت لەسەر حسابی چەندین شتی تر دەبێت، هەربۆیە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((هلك المتنطعون، هلك المتنطعون، هلك المتنطعون[1])) واتە ئەوانەی بە ناهەق توندڕەوی دەکەن...

لە فەرموودەیەکی دیکەی پێغەمبەریشدا(دروودی خوای لەسەر بێت) هاتووە کە سەلمانی فارسی(خوا لێی ڕازی بێت) سەردانی ئەبیلدەردائی کرد تەماشای کرد کە ئوم دەرداء بەرگی کەڵتە و کۆنەی پۆشیوە و زۆر بەڕپووت دیارە، بۆیە پێی وت ئەوە بۆچی ئاوایت؟ وتی: بە ئەبیلدەردائی برات بڵێ دەستی لە دونیا شتووەتەوە، ئەوەبوو خواردنی ئامادەکرد و هێنای بۆ ئەبیلدەرداء ئەویش وتی: تۆ بخۆ من بەڕۆژووم، سەلمان پێی وت: تا تۆ نەخۆیت من دەمی لێ نادەم، ئەوەبوو خواردی ئینجا کە شەو داهات ئەبیلدەرداء بەتەمابوو هەستێت شەونوێژ بکات سەلمان پێی وت: بنوو، ئەویش نووست، دوای ماوەیەك ویستی هەستێت پێی وتەوە: بنوو، ئینجا کە سێیەکی کۆتایی شەو هات سەلمان پێی وت: دە ئێستا هەستە شەونوێژ بکە.. پێکەوە شەونوێژیان کرد، پاشان

---

١- مسلم، رقم: ٢٦٧٠

سەلمان پێی وت: پەروەردگارت مافی بەسەرتەوە هەیە و، لاشەت مافی بەسەرتەوە هەیە و، خێزان و هاوسەرەکەیشت مافی بەسەرتەوە هەیە، کەوایە هەر شتە و مافی خۆی پێبدە.

ڕووداوەکەیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((سەلمان ڕاستی فەرموو)).[1]

هەروەها سێ کەسی خزم هاتن بۆ ماڵی هاوسەرانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، پرسیاریان لەبارەی پەرستنییەوە دەکرد، کە پێیانوترا سەریان سوڕما و وتیان: ئێمە لە کوێین لەچاو پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە کاتێکدا خوا لە گوناهی پێش و پاشی خۆش بووە. یەکێکیان وتی: من هەموو شەوەکە بە شەونوێژ زیندوو دەکەمەوە، یەکێکی تریان وتی: من هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو دەبم و نایشکێنم، یەکێکی تریش وتی: من واز لە ژن دەهێنم و هەرگیز ژن ناهێنم..

کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) چاوی پێیان کەوت فەرمووی: ئەوە ئێوە بوون وا و واتان وتووە.. سوێند بێت بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لەخوا دەترسم و خوا دەپەرستم، بەڵام ڕۆژوو دەگرم و دەیشکێنم و، نوێژیش دەکەم و دەشنوم و، ژنیش دەهێنم، بۆیە هەر کەسێك واز لە سوننەتم بهێنێت ئەوە لە من نییە..[2]

---

١- البخاري، رقم: ٥٧٩٣

٢- البخاري، رقم: ٤٧٧٦

زیادەڕەویکردن لە ئایینداا مرۆڤ ناچار بە کردنی کارگەلێك دەکات کە فەرزنەکراون لەسەری و، دەبێتە مایەی لە دەستدانی شتانێکی گرنگ لە ژیانیدا.. باشە بۆچی ئەو کارە ڕوودەدات..؟

وەڵام: چونکە تواناکانی ئێمە کەم و سنووردارن و، کاتێك زیادەڕەوی لە کارێکدا دەکەین ئەو زیادەڕەوییە لەسەر حسابی شتانێکی دیکە دەبێت..

کەواتە: وابەستەبوون بە سوننەتەوە و، دوورەپەرێزی لە زیادەڕەویکردن دوو فاکتەری هاوسەنگیکردنن لە ژیانی موسوڵماندا، هاوکات لەگەڵ ئەو دوو کارە سەرەکییەی پێشتر ئاماژەم پێکردن؛ کە ئەوانیش مەسەلەی زانینی ئەرکەکانمان و زانینی ئامانجەکانە زۆر بەوردیی و بە ڕوونی. ئەمانە هەموویان شتی سەرەکین بۆ هۆشیاربوونەوەمان لەبارەی پرسی هاوسەنگیبوون و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە ژیاندا..

دەڵێم: هاوسەنگی پێویستی بە دووپاتکردنەوەی بەردەوام هەیە؛ واتە: کەسمان ناتوانێت بڵێت: سوپاس بۆ خوا من کەسێکم هاوسەنگیم ڕاگرتووە و، ئیدی بێدەنگ بێت..

من ئەو کەسەی کە هاوسەنگییەکی وردی لە ژیانیدا کردووە دەچووێنم بەو کەسەی کە بەسەر پەتێکی گرێدراودا ڕێدەکات، ئەو هەرگیز ناتوانێت بڵێت: سوپاس بۆ خوا پێم خستە سەر پەتەکە و، تەواو لێبوومەوە..

تۆش بۆ ئەوەی بەسەر پەتێکی گرێدراودا ڕێبکەیت و، تاوەکو بەلای ڕاست و چەپدا نەکەویت، دەبێت بۆ هەر ساتێکی ڕێکردنت هاوسەنگیی خۆت ڕابگریت، بەڵێ هەر بەو شێوەیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا دووچاری چەندین حاڵەتی کتوپڕ دەبین گەر بێتو وریای خۆمان نەبین تەنگمان پێهەڵدەچنن و گەلێك ئیشوکاری تریان بۆ دەکەینە قوربانی.

گەنجانێکی زۆر دەناسم کاتێك کە بە خوێندنەوەی ڕۆمانێکەوە سەرقاڵ دەبن، بەبێ گوێدانە ناوەڕۆکەکەی، کە ڕەنگە ناوەڕۆکەکەیشی زۆر باش و سوودبەخش بێت، ئەوەندە دەچنە ناخی بابەتەکەوە و چێژی لێدەبینن دەبینیت هەریەکەیان دەڵێت: بەخوا من ئێستا ناتوانم دەستی لێهەڵبگرم..؟؟

هەندێ گەنج دەناسم کە نوێژی بەکۆمەڵی دەفەوتێت؛ چونکە پێت دەڵێت: حەز ناکەم دەست لەم بابەتە هەڵبگرم هەتا لەم پەڕەیە نەبمەوە، یان لەم بەشە نەبمەوە، یان...!! ئیدی نوێژی جەماعەتەکەی لەدەست دەچێت، ئەوسا بە تەنیا نوێژەکەی دەکات.!

یان کۆمەڵێك ئەرکی تری بەسەرەوەیە، یان تاقیکرنەوەیەکی هەیە، یان ئەرکی قوتابخانەی بەسەرەوەیە، یان کەسوکارەکەی ئەرکێکی گرنگی پێدەسپێرن.. دەبینیت وازی لێدێنێت و، دەڵێت جاری هەر ئەمڕۆ و سبەینێم ماوە لە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە ببمەوە.. خوا یار بێت کە لێبوومەوە دەرمانەکان بۆ خوشکەکەم دێنم، لە کاتێکدا دەرمان شتێکە دواناخرێت..

کەواتە..

زۆر شتی کتوپڕ و ناکاو بەسەر ژیانماندا دێت کە هاوسەنگیمان تێکدەدات، بۆیە دەبێت زۆر چاوکراوە بین و، هەمیشە مرۆڤ ئاگای لەم پرسیارە بێت:

## ئایا من کەسێکی هاوسەنگم..؟؟

... هاوسەنگی شتێکە پێویستی بە دووپاتکردنەوەی بەردەوام هەیە، ڕەنگە هەنووکە زۆربەمان تووشی کێشە و گرفتێك بووبین لە ژیانماندا بەبێ ئەوەی پێی بزانین، دەشێت کەسایەتیمان هاوسەنگی لەدەستدابێت، یان دووربین لە میانەڕەوی بەبێ ئەوەی ئاگامان لەخۆمان بێت..!!

ئەگەر بشپرسین و بلێین بۆچی ئاگامان لە خۆمان نییە...؟

لە وەلامدا دەلێین: چونکە ئەو چەمك و واتایانەی کە هاوکاریمان دەکەن لە پەیبردن بە کێشەکەمان بەردەست نین، ئەوەش خالێکی گرنگە، واتە ئەقلّ و هۆشمان لە توانایدا نییە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ پەی بە شتەکان ببات، کە بێگومان چەمکەکان بۆی دەبنە ئامراز، بۆیە ئەگەر چەمك و واتایەکی دیاریکراومان لەبارەی بابەتێکەوە لەبەر دەستدا نەبوو، ئەوا ناتوانین لەو بابەتە تێبگەین؛ چونکە ئەو ئامرازەی کە ئەقلّ و ژیریمان بەکاری دەهێنێت بەردەست نییە.

کەواتە..

هاوسەنگی ژمارەیەك چەمك و واتـای هەیـە، ئەگـەر ئـەقڵ و هۆشمـان پەی بەو چەمکانە نەبات، ئەوا سـەرمان لێدەشـێوێت و، ژیانمـان لێ تـاڵ دەبێت و، کەسایەتیمان لەکەدار دەبێت، بەبیّ ئەوەی هەستی پێبکـەین؛ چونکە ئەو ئامرازەمان نییە کە بەهۆیەوە پـەی بـە هاوسـەنگی ببـەین و ژیانمانی پیّ ڕاگیر بکەین..

# هاوسەنگی
## لە نێوان سەرفرازی و سەرکەوتندا



یەکەم هاوسەنگی کە لەبارەیەوە دەدوێین هاوسەنگیی نێوان سەرفرازی و سەرکەوتنە، ئاشکرایە زۆربەی کات سەرفرازی - کە پەیوەندی بەو دونیاوەیە - بە گوێڕایەڵی و خواپەرستی و نزیکبوونەوە لە خوای گەورەوە بەستراوەتەوە.

بەڵام کە باسی وشەی سەرکەوتن دەکەین زۆربەی کات مەبەستمان لە سەرکەوتنمانە لە دونیادا، بۆ نموونە کاتێك کە دەڵێین فلان کەسێکی چاکە یان فلانە کەس پیاوچاکە.. ناڵێین لە کارەکەیدا سەرکەتووە یان سەرکەوتوو نییە، ڕەنگە سەرکەتوو بێت لە کارەکەیدا و، ڕەنگیشە سەرکەوتوو نەبێت لە کارەکەیدا.. بەڵام دەڵێین: ئەو کەسێکی چاکە، یان فلانە کەس پیاوچاکە.. سەبارەت بە سەرکەوتنیش ئێمە ئێستا بۆ سەرکەوتنی ئەم دونیا بەکاری دەهێنین.

کاتێك کە بە وردی سەرنج دەدەین، دەبینین هیچ کێشەیەکی تێدا نییە؛ چونکە سەرکەوتنی ئەم دونیا ئەگەر لە چوارچێوەیەکی شەرعی و دروستدا بێت و نیەتێکی پاکی لە پشتەوە بێت، ئەوا پەیوەندی بە سەرفرازی ئەو دونیاوە هەیە.

ئەگەر بشگەڕێینەوە بۆ نزیکی ٥٠ ساڵ بەر لە ئێستا، ئەوا دەبینین بیرۆکەی سەرکەوتن لە ناو ئوممەتی ئیسلامدا بەشێوەیەکی گشتی بیرۆکەیەکی لاواز بووە..

بەڵام بیرۆکەی چاکەخوازی بەپێی تێگەیشتنی ئەو سەردەمە بەهێزتر بوو و، بیرۆکەی سەرکەوتنیش لاواز بوو..

بێگومان ئەوەش گرفتە؛ بۆیە ئەو موسوڵمانەی کە قەرز و قۆڵە دەکات و ورگی پڕ دەکات، ئەوە گرفتێك لە کەسایەتیدا هەیە.. ئەو موسوڵمانەشی کە سەرپەرشتیی دامەزراوەیەك دەکات و شکستی پێدەهێنێت، گرفتێك لە کەسایەتیدا هەیە.. ئەو موسوڵمانەشی کە هاوسەرگیری دەکات و سەرکەوتوو نابێت لەو پرۆسەیەدا گرفتێك لە کەسایەتیدا هەیە.. ئەو موسوڵمانەشی کە ئەرکەکانی سەرشانی بەرامبەر بە پەروەردگاری بۆ هەڵناسوڕێت، کەسێکی شکستخواردووە و گرفتێك لە کەسایەتیدا هەیە.. بەڵام ئەوەی ئێستا هەستی پێدەکەم نەك تەنها لاوانمان بەڵکو ئوممەتی ئیسلامی بەگشتی هۆشیار بووەتەوە و خەریکە سەرلەنوێ کەسایەتیی خۆی بونیاد دەنێتەوە.. ئێستا هەمووان عەودالی وەلامی ئەم پرسیارانەن:

چۆن سەربکەوین، چۆن پێشبکەوین و پەرە بە خۆمان بدەین و، چۆن.. و، چۆن... بکەین؟؟

وای لێهاتووە ئێستا بیرۆکەی چاکەخوازی و سەرفرازی لای زۆربەی خەڵکی بەرەبەرە خەریکە پاشەکشە دەکات.

ئەگەر بەڕێزیشت خوازیاری ئاشنابوونی بە ڕەوشی کۆمەڵگەیەك، ئەوا سەرنجبدە بزانە لە ناو کۆڕ و دانیشتنەکانیاندا باس باسی چییە، چونکە ئەوەی بە تایبەتی لە کۆڕ و دەمەتەقێی شەواندا دەگوترێت خەم و خواست و ئاواتەکانیانی لەخۆگرتووە.. ئاشکراشە کە زۆربەی قسە و باسی ئەمڕۆی خەڵك: فلانە کەس ئەوەندەی قازانج کرد و، فلانە کەس ماشەڵڵای لێبێت مامۆستایەکی سەرکەوتووە و، فلان وایە و، فلانیش ئاوایە.. بەجارێك باس باسی پرسی سەرکەوتنە، ئەوەش پەیوەندی بە پایەدارییەوە نییە بەڵکو پەیوەندی بەهێز و تواناوە هەیە...!

ماوەیەك بەر لە ئێستا کەناڵێکی ئاسمانی دیدارێکی لەگەڵ کەسێکی ناموسوڵمانی بەناوبانگدا سازکرد، ئەو بێژەرەی کە دیدارەکەی لەگەڵدا سازدەکرد ئەویش ناموسوڵمان بوو پێی وت: ئەگەر بەهەشتێك لە جیهانێکی دیکە لەئارادا بێت و، بچیتە بەهەشتەوە، ئایا ئەو وشەیە چییە کە پێت خۆشە لە خواوە گوێبیستی بیت..؟

پێی وت: پێم خۆشە گوێم لێی بێت پێم بڵێت: تۆ کەسێکی ئازا و چاونەترس بوویت..

ئازایەتی هێزێکی پەیوەستە بە هێز و دەسەڵاتەوە، بۆیە ئەو گوڕ و تینەی ئێستا، لە خەمی سەرکەوتن و پشتگوێخستنی پرسی سەرفرازی

و چاکەخوازیی تیاماندایە هەمووی ئاسەواری جیهانگیرییە و، لە کەلتوور و فەرهـەنگی ڕۆژئـاواوە دزەی کردووەتـە نێـو کـەلتوور و هۆشـیاری ئێمەوە..

ئێسـتا بـیر و هۆشـیاری ئوممـەتی ئیسـلام ناوەنـاوە خەریکـە بـە چەمکەکانی ڕۆژئاوا دەتەنرێت، کە پێچەوانەی بونیادی قووڵی کەلتوور و فەرهەنگی ئیسلامیمان دەوەستێتەوە و زیانی زۆری پێدەگەیەنێت..

منیش لەو کەسانەم کـە زۆر هـانی خـەڵکی دەدەم بـۆ سـەرکەوتن و، ئێستاشی لەگەڵ بێت دەڵێم: **ئوممەتی ئیسلام پێویستی بە کەسانێکی زۆری سەرکەوتوو هەیە؛** چونکە ئوممەتێکی بێهێزە و، لە ئاکامی لاوازیی چەمکەکانی سەرکەوتنی کەسـی و گشـتی و، پووکانـەوەی چـەمکەکانی هێـز بەدرێـژایی دە سـەدەی ڕابـردوو .. بوونـە مایـەی پەراوێزخسـتنی ئوممـەتی ئیسـلام و کردیانـە لـەوەڕێکی حـەڵاڵ بـۆ کەسـانی دیکـە و.. بەرهەمەکەیشـیمان دوورییـەوە، گومانیشـی تێـدا نییـە هێشـتا هـەر بەدەستیەوە دەناڵێنین، لەبەر ئەوە **ئێمـە زۆر پێویسـتمان بـە کەسـانی سەرکەوتووە.**

بەڵام دەمەوێت جەخت لەسە ئەوە بکەمەوە کە پێشتریش دووپـاتم کردووەتەوە و، خوا یار بێت چەندین جاری دیکەش دووپاتی دەکەمـەوە و دەڵێم:

**هـەر سـەکەوتنێکی ئـەم دونیـای فانییـە خزمـەت بـە سـەرکەوتن و سەرفرازیی ئەو دونیای هەتاهەتایی نەکات، ئەوە سەرکەوتنێکی کاتییە و دەبڕێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەشێوازی ڕەوا و ڕێگەپێدراویش بەدەست**

هاتبێت.. هەر سەرکەوتنێکیش بە ڕێگە و شێوازی ناڕەوا و ڕێگەپێنەدراو بەدەست بێت ئەوە خەیاڵە و دەڕەوێتەوە.

جا ئەو کەسەی کە لە ڕێی سووخواردنەوە.. یان لە ڕێی بەرتیل خۆرییەوە.. یان لە ڕێی پێشێلکردنی یاسا و ڕێسا باو و باوەڕپێکراوەکانەوە.. یان لە ڕێی فێڵ و تەڵەکەبازییەوە.. یان لە ڕێی گزی و ساختەکارییەوە.. یان لە ڕێی درۆ و دەلەسەوە.. سەروەت و سامان پێکەوە بنێت، ئەوە بەدەستی خۆی خەریکە ئاگر لە خۆی بەردەدات و، سەرکەوتنەکەشی سەرکەوتنێکی خەیاڵییە و ڕاستەقینە نییە.. ئەو سەرکەوتنەشی ـ وەك ئاماژەم پێدا ـ کە بە ڕێگە و شێوازی دروست و ڕێگەپێدراو بەدەست دێت ئەگەر خزمەت بە سەرکەوتن و سەرفرازیی ئەو دونیای هەتاهەتایی نەکات، ئەوە سەرکەوتنێکی کاتییە و دەبڕێتەوە و، هەرگیز هیچی لەگەڵ خۆتدا نابەیت.. لەم دونیا بەجێ دەمێنێت..

کەوابوو.. ڕاگرتنی هاوسەنگی لەم بابەتەدا بەوەیە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنین کە لە خوای گەورەمان نزیك بخاتەوە، باشە چۆن لە خوا نزیکمان دەخاتەوە..؟؟

وەڵام: ئەگەر هاتوو بە شێوازێکی دروست و ڕێگەپێدراو بەدەست هات و، نیەتی پاکی لە پشتەوە بوو.

بۆ نموونە: بڵێت پارە و پوولێك پێکەوە دەنێم تاوەکو کارگەیەکی پێبکەمەوە، خوا یار بێت دە کەسی تێدا دادەمەزرێنم کە بتوانن بژێوی ژیانی دە خێزانی موسوڵمانی پێ بەڕێوە ببەن، پشتیوان بە خوا

هەرچیەکیشی لێ مایەوە خوێندنگەیەك یان مزگەوتێکی لێ دروست دەکەم[1]، خوا یار بێت ٢،٥٪ی زەکاتی سامانەکەم دەکەمە ٥٪ و بەشێوەی سەدەقە و زەکات دەیبەخشمەوە بەسەر موسوڵماناندا تا سوودی لێببینن..

ئەم سەرکەوتنە کاتێك بە نیەتێکی پاك و، بە شێوازی دروست و ڕێگەپێدراو بەدیدێت و بە پایان دەگات.. بێگومان دەبێتە هۆکارێکی باشی نزیکبوونەوەمان لە خوا.

کەوایە.. لە لایەکەوە بیرۆکەی چاکخوازی و سەرفرازیمان هەیە و لە لایەکی دیکەش بیرۆکەی سەرکەوتن و پێشکەوتنمان هەیە.. بۆیە پێویستە لەسەرمان بگەڕێینەوە بۆ بیرۆکەی چاکخوازی و بۆ بیرۆکەی قەشەنگی سەرفرازی.. بیرۆکەی حەڵاڵزادەیی، کە بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە خەڵك خەریکە بەرەبەرە بیریان دەچێتەوە..

بۆ نموونە پێت دەڵێت: براکەم، فلانە کەس پاڵەوانە.. فلانە کەس شێرە.. پاروەکەی لە دەمی شێردا دەردەهێنێت.. دەزانێت چۆن گوزەران بکات، خەمی بۆ مەخۆ..!!

دەمانەوێت وشەی (حەڵاڵزادە) و، بیرۆکەی مرۆڤی چاکەکار و، خواناس و، ڕەوشتبەرز و، هۆگر و، بەخشندە لەدەست نەدەین.. دەمانەوێت ئەم سیفەتە جوانانەمان لەکیس نەچێت.

---

١- یان لەگەڵ چەند خوشك و برایەکدا هەوڵی دامەزراندنی کەناڵێکی ئاسمانی هاوسەنگکار دەدەین.

ئەی ئەو کەسانەی بە تەنگ سەرکەوتنەوەن نەکەن ئەو سەرکەوتن و سەرفرازییە لەیاد بکەن کە بە سەرکەوتن و سەرفرازیی هەردوو دونیاتان دەگەیەنێت.

ئەی ئەو کەسانەشی لە کاری چاکەدا ڕۆچوون و بەجارێك دونیاتان فەرامۆش کردووە، لە خوا بترسن.. بنەمایەکی جوان هەیە دەڵێت: **هەر موسوڵمانێك نەتوانێت کێشە و گرفتە تایبەتییەکانی چارەسەر بکات، خۆی دەبێتە کێشە و گرفتێکی کۆمەڵایەتی.** ئەو موسوڵمانەی نەتوانێت کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات دەبێتە کێشە و بار بەسەر گەل و نەتەوە و، خزم و کەسوکاریەوە.

پیاوێك کە نەیتوانی کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان خۆی و هاوسەرەکەی چارەسەر بکات و، گەیاندییە دادگاکان و، کەسوکاری هەموویان پێیان زانین و، خەڵکی بۆ چەندین ساڵ هەر خەریکی ئاشتەوایی بوون لە نێوانیاندا.. ئەو کەسە دەبێتە کێشە و سەرئێشە بۆ کەسانی دیکە.. کەسێك نەتوانێت نان پەیدا بکات، دەبێتە بار بەسەر دەوڵەتەوە، دەبێتە بار بەسەر کەسوکاریەوە، دەبێتە بار بەسەر هاوڕێیانیەوە..

بۆیە چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتە تایبەتییەکانمان بەشێکە لە پایەداری و سەرفرازی؛ تاوەکو نەبینە کێشە و بار و، سەرئێشە بۆ کەسانی تر.

# هاوسەنگی

## لە نێوان کار و زانستدا..



کەسانێکی زۆر هەن گرنگییەکی لە ڕادەبەدەریان بە زانست داوە، دەڵێین: فلان ڕۆشنبیرە و، شێت و شەیدای پەرتووکە، لەگەڵ کتێبێك تەواو دەکات دەست بەخوێندنەوەی کتێبێکی تر دەکات.. کەسێکی زۆر خەمخۆرە، بەڵام کە دێتە سەر ئەوەی بە کردەوە جێبەجێی بکات دەبینین ئەم کەسە نموونەی کەسێکی بێکەڵکە و هیچی لێ ناوەشێتەوە، زۆر لەبارەی سەرکەوتنەوە دەخوێنێتەوە، بەڵام کەسێکی شکستخواردووە..!! یان دەربارەی ڕەوشتبەرزی دەخوێنێتەوە، کەچی بەدڕەوشتە..!! یان دەربارەی کار و ئەرك و فەرزەکان دەخوێنێتەوە، کەچی بێباك و ساردوسڕە و گوێ بە ئەرکەکانی سەر شانی نادات..!! دەربارەی زۆر شت دەخوێنێتەوە، بەڵام لە ژیانیدا ڕەنگیان نەداوەتەوە..!!

بنەمایەکی گرنگی دیکە لەم بارەیەوە هەیە دەڵێت: ئەگەر خوا بە زانستی کەم سوودت پێنەگەیەنێت، ئەوا زۆربەی کات بە زانستی زۆریش

سوودمەند نابێت.. بۆیە ئەگەر سوود لە زانستی پەیوەندیدار بە ئەرکەکانەوە نەبینیت، ئیدی چۆن سوود لەو زانستەی پەیوەندی بە ڕەوشت و ئاکارەکانەوە هەیە، یان بە سوننەتەکان، یان بە فەلسەفەی مێژوو، یان بە پلاندانان بۆ داهاتووەوە هەیە دەبینیت..؟؟

ڕاستە بایەخدان بە زانست و زانیاری شتێکی سەرەکییە، بەڵام نابێت و هەرگیز ناشێت بایەخدانمان بە زانست بکەینە فاکتەرێك بۆ لەکەدارکردنی خود و کەسایەتی و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ کەسانی دی.. لە تەك ئەم کەسەدا کەسێکی دیکە هەیە هەر ئەوەندەی شتێکی بۆ باس بکەیت یان ڕوونکردنەوەیەکی بۆ بدەیت یان باسی بیرۆکەیەکی بۆ بکەیت یان ڕاڤەی بابەتێکی بۆ بکەیت، یان وتەیەکی قورس و گرانی بۆ بگوازیتەوە.. لە دڵی خۆیدا دەڵێت: دەستی بە فەلسەفە لێدان کردەوە.. ئینجا ڕێگە بەخۆی دەدات بەڕوویدا بێتەوە و بڵێت: بەڕێزم ئیتر با واز لە قسەی زل بهێنین، چونکە کردار شەرتە..!!!

.. ئێمە ئێستا کە باسی بابەتێك دەکەین و، کۆڕی شەوانمان گەرم کردووە و سەرگەرمی هەوڵ و کۆشش و سوود وەرگرتنین لە یەکتری، چی بکەین باشە..؟ باش وایە ڕەچاوی کات بکەین و بە قووڵی تاوتوێی بابەتەکان بکەین و تا بۆمان دەکرێت بەباشی لێیان تێبگەین، ئێستا کاتی کارکردن و بەکرداریکردن نییە، بەکرداریکردن کاتی خۆی هەیە.. بەڵام (ئەو) ناتوانێت لە مانا و مەبەستە جوان و قووڵ و ئاڵۆزەکان بگات، بۆیە بەگشتی پشتیان تێدەکات و، قوت دەبێتەوە لێت و پێت دەڵێت: بەڕێزم گرنگ کارکردنە و کردار شەرتە..!!

دوای ماوەیەك بۆت دەردەكەوێت ئەم كەسە نە بیرمەند و ڕۆشنبیرە و، نە فێرخواز و، نە ئیشكەر.. نە ئەوەیە بیرمەند بێت و ڕۆشنبیرییەك بڵاو بكاتەوە و، نە ئەوەیشە كاری زۆر بێت و چاكەكاری بكات.

ئەگەر بۆ چەند خولەكێك پێكەوە دابنیشین و خەریكی تاوتوێكردنی بیرۆكەیەك بین.. ئایا ئێمە بەم كارەمان تۆمان لە كاركردن بێبەش كردووە.. یان پێمان وتویت: مادامەكی ئەم بیرۆكەیەمان لە ماوەی كاتژمێرێكدا تاوتوێ كرد ئیدی تۆ دەبێت شەونوێژ نەكەیت...!! نا نا.. كەس ڕێگەی لێ نەگرتوویت.. هەرچەندە دەشزانم كە گۆڕەپانی ئیسلامی تا ئەم ساتەش لە شتەكاندا قووڵنەبووەتەوە و، بە وردیی لێی نەكۆڵیوەتەوە و تێیان نەگەیشتووە و، نەیتوانیوە بە باشی لە كاری خوا لە بەدیهێناندا تێبگات، داماوە و نەیتوانیوە لەو مەترسییە ناڕاستەوخۆیانەی كە ڕووبەڕووی ئەم ئوممەتە بوونەتەوە تێبگات.. داماوە.. داماوە.. داماوە..

لەگەڵ ئەوەشدا دەبینیت زۆر كەس هەن پێت دەڵێن: بەڕێزم، ئیتر با بەس بێت فەلسەفە لێدان..! كەواتە.. دەبێت هاوسەنگی ڕابگرین..

مرۆڤ ئەگەر ئەركەكانی سەرشانی بەجێهێنا و، وازی لە حەرام و قەدەغەكراوەكان هێنا و، پەیڕەوی زۆربەی زۆری ئاكار و سوننەتەكانی كرد، ئەوە ئەركی كاركردنی بەجێهێناوە، بۆیە پاش ئەوە دەتوانێت تەواوی ئەو كاتەی كە ماوەتی لە تێگەیشتنی زانست و زانیاری و تاوتوێكردن و ڕاڤەكردن و پێشكەشكردنی تێزی نوێ و خوێندنەوە و كۆششكردن و بەدواداچوونی هەواڵە زانستییەكاندا بەسەر ببات.. بەوە

نە دەبێتە کەسێکی زیادەڕەو و کاتکوژ و، نە کەسایەتیشی لەکەدار دەبێت، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە مرۆڤ زۆر بخوێنێتەوە و، کەمتەرخەمی لە ئاست ئەرکەکان و ئاکار و سوننەتەکاندا بنوێنێت، یان خۆی بە سەربازێکی جێبەجێکار بزانێت و، بڵێت: تۆ فەرمان بکە و من تەنها جێبەجێکردنم لەسەرە..!!

هەربۆیە ئەم کۆمەڵە خەڵکە فرە جووڵە و بێ بەرهەمن، واتە ئەم جۆرە کەسە کاری زۆر دەکات و بەرهەمی کەمە؛ چونکە بە نەشارەزایی و بەبێ پلاندانان و بێ بوونی دیدگایەکی ڕوون کار دەکات، هیچ لە واتای (دابەشکردنی کار) و (کارایی) و (بەرهەمی بەپێز) نازانێت، چونکە ناخوێنێتەوە و، هیچ فێر نابێت..!!

کەوابوو.. پێویستە هاوسەنگی بکرێت لە نێوان کار و زانستدا، من هەمیشە دەڵێم: قەیرانێکی مێژوویی گەورەمان هەیە.. ئەو قەیرانە مێژووییە چییە و، ئەی کە مێژووییە و کۆنە ئیدی بۆچی بۆتانی باس دەکەم، من بۆ خۆم پێم وا نییە کە بەم نزیکانە ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام خوازیارین هەوڵی کەمکردنەوەی بدەین..؟

ئێمە بە درێژایی مێژوو سکاڵا لە دەست کەمی ژمارەی پێویستی مامۆستایان بۆ فێرکردن و گۆشکردنی نەوەی نوێ دەکەین، بۆ نموونە لە شارێکدا پێویستمان بە سەد بانگخواز هەیە، کەچی بەداخەوە دوو کەس زیاترمان دەست ناکەوێت.. یان پێویستمان بە هەزار پەروەردەکارە کەچی تەنها پەنجا پەروەردەکارمان دەست دەکەوێت.. لەبەر ئەوە ئەمە کێشە سەرەکییەکەیە..

کێ چەمکەکانی هاوسەنگی فێری خەڵکی دەکات تاوەکو ئومەت سەری لێنەشێوێت..؟

کێ فێریان دەکات و، لە کوێیە..؟

بەر لەوەش کێ پێوەرەکانی هاوسەنگی بەباشی دەزانێت؛ تاوەکو بیانگوازێتەوە بۆ کەسانی دیکە..؟

بێگومان ئەو کەسانە هەن، بەڵام بە گوێرەی پێویست نین..! دەبێت لەوە زیاتر بن، بەڵام ئەوەی کە لە ژیانماندا بەدیی دەکەین ئەوە نییە.

ئایا خوێنەری بەڕێز تۆ دەتوانیت ببیتە یەکێك لەو کەسانەی کە ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن دەگێڕن و، بەشداری لە سووککردنی ئەم کێشەیەدا دەکەن؛ کێشەی کەمی ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئەرکی پەروەردە و فێرکردن و ئاشناکردنی خەڵکی بە ئەرکەکانیان دەگرنە ئەستۆ.

# هاوسەنگی
## لە نێوان ئەقڵ و ڕۆحدا



ڕۆح و گیان مۆڵگەی مرۆڤە، مۆڵگەی کەسایەتییە، گیان و هەست و سۆزەکان بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤن، جا بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێتە کەسێکی بیرمەند، یان ببێتە کەسێکی خاوەن بیرکردنەوەی ڕاست و دروست، ئەوا پێویستی بە فێربوون هەیە؛ چونکە ئەوە شتێکی وەرگیراوە، بەڵام هەرگیز کەس پێویستی بەوە نییە فێری ئەوە ببێت چۆن دڵخۆش بێت، چۆن خەمبار بێت، چۆن تووڕە بێت، چۆن خەڵکی خۆشبوێت، چۆن ڕقی لە خەڵك بێتەوە.. چونکە ئەوانە شتانێکی بنەڕەتین لە کەسایەتیدا و ڕەگ و ڕیشەیان داکوتاوە و پێویستیان بە فێربوون نییە، بەڵام مرۆڤ پێویستی بەوەیە فێر ببێت چۆن بیر بکاتەوە و هەڵوێست وەربگرێت.. هەندێ کەسیش بە تایبەتی لەم بوارە ڕۆحیەدا[1] گرفتیان هەیە، ئەم

---

١- ئەوەی لایەنی ڕۆحی و گیانی ئێمەی موسوڵمان تێر دەکات تەنها یەك شتە، ئەویش خواپەرستییە، کە بە تاکە سەرچاوەی بەهێزکردنی ڕۆح لەقەڵەم دەدرێت.. بەڵام

گرفتەش کاتێك کە مرۆڤ زۆر بە توندیی و لە ئەندازە بەدەر بایەخ بە لایەنی ڕۆحی و گیانی دەدات زەق دەبێتەوە و خۆی دەنوێنێت؛ لەبەر ئەوەی کە بواری ڕۆحی بوارێکە سەرنجڕاکێشە و کەمەندکێشت دەکات بۆ لای خۆی؛ بۆیە کاتێك مرۆڤ بە قووڵی دەچێتە ناو ئەو جیهانەوە ئیدی هەرچی شتی دیکەیە لەبیری دەباتەوە.

کەسێك کە بەر لە خۆرهەڵاتن لەخەو هەڵدەستێت و یادی خوا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە و بەکوڵ دەگری و دڵی پڕ دەبێت لە نووری ئیمان.. ئەم مرۆڤە نیازی بە کەس نییە، بە دوای دونیادا وێڵ نییە، دواجار کەسێکی بەختەوەر و ئاسوودەی لێدەردەچێت، بەڵام ئەگەر لەسەر حسابی شتانێکی دیکەی گرنگ ئەم کارە بکات، ئەوسا دەبینیت کە گوێ بە لایەنی کۆمەڵایەتی نادات و، بێباکە لە ئاست خوێندنەوە و خۆڕۆشنبیرکردندا و، کێشە و گرفتی کۆمەڵگاکەی پشتگوێخستووە و، تەنانەت ئاگای لە حاڵی دراوسێکەشی نامێنێت؛ واتە دڵخۆشێکی بێئاگایە..

لەبەر ئەوە.. ئەوانەی دەچنە ناو ئەم بوارەوە پێویستە زۆر وریا بن لەوەی کە بە توندی و بە قووڵی کەمەندکێشی بن، ئەم بوارە بەم شێوەیەی باسمان کرد هەر تەنها ئەو کاریگەرییە نەرێنییەی نابێت و تەنها لەو کۆمەڵە شتە گرنگەت دانابڕێت، بەڵکو لەبەر توندیی

---

ئەوەی کە دەروون و ڕۆحی ڕۆژئاواییەکان تێر دەکات مۆسیقایە، وەکو لە پەروەردە و کەلتوورییاندا بەدیدەکەین.. (د. بکار)

کەمەندکێشـییەکەی تەنانـەت لـە پیـادەکردنی سوننەتیشـت دەخـات، ئاشکرایە خەڵکانێکی زۆر بەهۆی قووڵبوونەوەیان لە بابەتە ڕۆحیەکان لە شارێی سوننەتی پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەر بێـت) لایـان داوە و سەرپێچی یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیان کردووە، هەنـدێك جاریش لـە بازنەی ئیسلام کردونیەتییـە دەرەوە.. بۆیـە پێویستە مـرۆڤ زۆر بـەئاگا بێت..

سەرەڕای بواری ڕۆحی و گیانی بواری هزر و بیر و ژیریمان هەیە.. ئەم بوارەش بە سروشتی خۆی وشکە، تەنانەت قسە و باسی بیرمەندان قسە و باسێکی نـاڕوون و تێکـەڵ و پێکەڵـە، قسـە و باسـێکی وشـك، قسـە و باسـێکی بێـزراو، هەنـدێ کەسـیش دەڵـێن: کاتێـك لەگـەڵ بیرمەنـد و ڕۆشـنبیرێکدا کۆدەبینـەوە هـەر تـەنها لـەبارەی کێشـە و قەیرانەکانـەوە قسـەمان بـۆ دەکـات و، تـەنها لـە بـارەی بـەڵا و مەینەتیەکانـەوە دەماندوێنێت..

باشە کاتێـك دەچیتە لای پزیشـکێك پێشبینی چیی لێدەکـەیت، بـە تەمایت بڵێت: ماشەڵات لێبێت؛ تـۆ بـەهێزترین کەسـی ئـەم شـارەیت..؟ نەخێر.. جارێ پزیشك هەقی نییە بەسەر لەشساغەکانەوە، ئینجا مرۆڤی لەشساغ کاری بە نەخۆشخانە نییە، لەبەر ئەوە قسە و باسـی پزیشـکان قسە و باسێکی تایبـەت بـە کێشـە و نەخۆشـییەکانە، سـەرنج بـدە چـی دەڵێن: "کەسێك هاتە لامان قاچیمان بۆ بڕییـەوە.. نەشتەرگەرییەکمان بۆ فڵانە کەس ئەنجامدا.." لەوە زیاتر بەتەمایت چیت پێ بڵێن..

بۆیە کاتێك دێیت و دەربارەی حاڵی گەل و نەتەوەیەك دەپرسیت و ڕاوێژ بە کەسێکی ڕۆشنبیر دەکەیت، دەی دیارە ئەویش دەربارەی کێشە و قەیرانەکانی ئەو گەلە قسە و باست بۆ دەکات و ڕوونکردنەوەت پێدەدات... کە بێگومان ئەوە شتێکی ئاساییە..

لەبەر ئەوە بواری ئەقڵی و بواری هزر و بیر و ژیریی بوارێکی وشکە و، بواری هۆشمەندییە و، بواری خەمانە.. دەخوازرێت لەو کەسانەی کە لەو بوارەدا کار دەکەن بواری ڕۆحییان لەیاد نەچێت و، وا گومان نەبەن کە بیرمەندێتی و قسەی زل زیاتر دڵ و دەروون و ڕۆحیان پاراو دەکات، یان هاوسەنگییان ڕادەگرێت.

بیرکردنەوە و لێکدانەوە و تێگەیشتن پێویستە، بەڵام پێویستە لەسەریان بواری ڕۆحییان لەیاد نەچێت؛ چونکە بنچینەی بەختەوەریی هەردوو دونیایانە..

با هەر شتە و بۆ شوێنی شیاوی خۆی بەکاربهێنین:

- ڕۆح و گیان سەرچاوەی وزە و بەختەوەرییە.
- ئەقڵ و زانست بۆ لێکۆڵینەوە و پلاندانانە، هەرگیز ناتوانیت بەبێ زانست و زانیاری و بیرکردنەوە و پلاندانان ڕێگای ڕاست بگریتەبەر، بێگومان پلان و نەخشەی ورد و تۆکمەش بەبێ وزەیەکی بزوێنەر دیسان سوودی نابێت.

**ئەی ئەو وزە بزوێنەرەمان چۆن دەست بکەوێت..؟**

وزەی بزوێنەر لە بواری گیانی و ڕۆحیدا دەستدەکەوێت.. تەماشای عومەیری کوڕی حومام (خوا لێی ڕازی بێت) بکە فەرمووی: جا من چاوەڕێ بکەم تا ئەم چەند دانە خورمایە بخۆم، زۆر دەخایەنێت.. بۆیە تەواوی خورماکانی کە پێی بوون فڕێی دان، پاشان شەڕی لەگەڵ کردن تاوەکو کوژرا..[1]

هەروەها قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمیش (خوا لێی ڕازی بێت) ئەبوبەکری سدیق (خوا لێی ڕازی بێت) لەبارەیەوە دەیفەرموو: **دەنگ و هاواری قەعقاع لە سوپادا لە هەزار پیاو باشتر بوو**[2].

وتراوە: ئەم پیاوە کاتێك کە جەنگ بۆ ماوەیەکی کورت دەوەستا و، پشوویەکیان بۆ وەردەگرت، نەیاندەتوانی دەستی لە دەسکی شمشێرەکە بکەنەوە مەگەر کەمێك ئاوی گەرمیان بەسەردا بکردایە تاوەکو نەرم ببوایەتەوە، ئەوسا لەپی دەستی دەکرایەوەو دەسکەکەی لێ دوور دەخرایەوە..

دەبێت ئەو بارە ڕۆحییە چی بێت کە وا لە مرۆڤ بکات بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێکی لەسەر یەك بجەنگێت تا ئەو ڕاددەیەی کە دەستی بە دەسکی شمشێرەوە دەق بگرێت و لێ نەبێتەوە..؟

---

[1]- مسلم، كتاب: الإمارة . باب: ثبوت الجنة للشهيد. رقم: ١٩٠١

[2]- کتێبی (الإصابة في تمييز الصحابة)، ژمارە: ٧١٣٢

بێگومان ناتوانین گەورەیی ئەو وزە ڕۆحی و گیانییەی کە قەعقاع (خوا لێی ڕازی بێت) هەیبووە وێنا بکەین..!!

کەواتە.. دەبێت هاوسەنگی لە نێوان ئەقڵ و ڕۆحدا ڕابگیرێت و، کاتێکیش بڕیارێك دەدەین پێویستە بزانین کە هەست و سۆز لە بڕیارداندا جێی نابێتەوە.. بەڵام کە دێینە سەر بواری جێبەجێکردن ئەوا بەبێ هەست و سۆز و، ڕۆح و گیان و، پەرۆشی و دڵگەرمی و، ئارەزوو و شەیدابوون ناتوانین هیچ شتێك بە ئەنجام بگەیەنین.

# هاوسەنگی
## لە نێوان ئەقڵ و زانستدا



لەو جیهانەی کە نەخوێندەواری باڵی بەسەردا کێشاوە.. نەریتەکانیم ناو ناوە نەریتی کەلتوور و ڕۆشنبیریی زارەکی.. کەلتوور و ڕۆشنبیریی زارەکیش بەشی زۆری کۆمەڵگە نەخوێندەوارەکانی گرتووەتەوە، زۆربەی کۆمەڵگەکان نەخوێندەوارن یان کەلتووری نەخوێندەواریی بەسەریاندا زاڵە، کە بریتییە لە کەلتووری لاساییکردنەوەی سەرزارەکی" واتە: ئەو کەلتوورەی کە خەڵکەکە دەماودەم وەریدەگرن و بڵاوی دەکەنەوە، نەك لە ڕێگەی خوێندنەوەوە..

لە چەند وڵاتێکی ئیسلامیدا تا ئێستاش ڕێژەی نەخوێندەواریی تێیدا ٧٠٪یە و، تێکڕای ڕێژەی نەخوێندەواریی لە جیهانی ئیسلامیدا تا ئەم ساتەش نزیکەی ٤٠٪ە ..! بێگومان وڵاتی واشمان هەیە، سوپاس بۆ خوا ڕێژەی نەخوێندەواری تێیدا لە سەدا یەك یان دووە..

لەو کۆمەڵگایانەی کە کەلتووری سەرزارەکی باڵی بەسەریاندا کێشاوە، زۆربەیان نەخوێندەوارن، یان نزیکن لە نەخوێندەوارییەوە، یان

تـــازە ڕوویـــان لـــە نەخوێنـــدەواریی کـــردووە، یـــان نەخوێنـــدەواریی بەشـێوەیەکی زۆر تیایانـدا بڵاوبووەتـەوە.. لـەم کۆمەڵگایانـەدا ئـەقڵ و هۆش گرنگی زیاتری پێدەدرێت لەچاو زانستدا؛ لەبەر ئەوە پێت دەڵێـت: بیخەرە مێشکتەوە.. یان دەڵێت: هەر بە ئەقڵ دیارە..

کـاتێکیش لـە کـۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا دەربـارەی بابـەتێکی پزیشـکی پرسـیار لـە پزیشـکێك دەکرێـت، دەبیـنین بـەر لـەوەی دکتۆرەکـە زاری بکاتەوە چەندین کەس خۆیان لە وەڵامەکەی هەڵدەقورتێنن، لە کاتێکدا زانیارییە ڕاستەکە لە لای پزیشکەکەیە، هـەر یەکـە لـە شـوێنی خۆیـەوە دەڵێت: دەی خۆ ئەوە هەر بە ئەقڵ دیارە.. ئینجا فەتوایەکی گشتی بـۆ بابـەتێکی تایبـەتی وەهـا دەردەکـات، بـۆ نموونـە دەڵێـت: خـۆت گـەرم بکەرەوە و، بە باشی خواردن بخۆ و، نەکەی خۆت نیگـەران و سـەغڵەت بکەیت..!!

بۆیە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا ئەقڵ و ئاوەز زیاد لە سەنگی خۆی گرنگـی پێـدەدرێت، بـەڵام لـە هـەموو کاتەکانـدا نـا.. بـەڵکو تـەنها لـەو کاتانەدا کە پێویستی بە زانست و زانیاری دەبێـت، ئێمـەش زانیارییمـان نییە، بۆیە ناچار بە ئارەزووی خۆمان شت دەڵێین.

لەبەر ئەوە ئەقڵ و ئاوەز لە هەقی خۆی زیاتر گەورە دەکرێت؟ ئەقڵی پـەتییش کـاری بـەو وردەکارییانـەوە نییـە کـە خاوەنەکـەی زانیـاریی و شـارەزایی لەبارەیانـەوە نییـە.. ئـەو تـەنها بنـەما و پـەیڕەوی گشـتی پێشکەش دەکات، بەڵام لە وردەکارییەکاندا ڕۆڵبینینەکە بۆ زانستە.

ئایا دەزانن کە ئەقڵ و ئاوەز ناتوانێت بەردەوام جیاوازی لە نێوان گرنگ و ناگرنگدا بکات و، ناتوانێت بەردەوام جیاوازی لە نێوان مەترسیدار و ئارامبەخشدا بکات.. هەندێ جاریش جیاوازی لە نێوان بابەتەکانی چاکە و خراپەدا ناکات.. بێگومان بەبێ زانست و زانیاری ناتوانێت ئەو جیاوازییانە بکات.

دەتوانین لە ڕێی زانست و زانین و شارەزاییەوە جیاوازی لە نێوان سەرجەم ئەو بابەتانەدا بکەین، بڕوانە چەند کەس بەهۆی بەکارهێنانی ئامێرێکی هەڵەوە دەستی بڕدراوەتەوە.. بۆیە بە تەنها ئەقڵی بەس نییە تاوەکو خۆی لەو ئامێرە بپارێزێت؛ چونکە خۆپاراستن لەو ئامێرە پێویستی بە زانست و شارەزاییە، نەك ئەقڵ؛ چونکە ئامێرەکە وردەکاریی زۆرە.

کەواتە.. زۆربەی خەڵکی ڕۆڵێکی گەورە بە بەراورد بە زاست و زانین دەدەنە ئەقڵ، بەڵام ڕۆڵێکی ناشایستەیە، ئەوان پێیان وایە لە میانەی تێڕامان و بیرکردنەوەوە ئەقڵ دەتوانێت تەواوی کێشە و گیروگرفتەکان چارەسەر بکات، بەڵام پشتڕاست کراوەتەوە کە ئەوە دوورە لە ڕاستییەوە و، هەرچی زانست و زانین و شارەزایی وردی نێو بەش و بابەتەکان هەیە گرنگترە لە بنەما گشتییەکانی ئەقڵ و ئاوەز.

لە بەرامبەریشدا کەسانێك هەن کە شادەماری زانستن و، زانیاری باشیان لایە، بەڵام هیچ کامێکیان ئەقڵی لەو زانیارییانەدا بەکار ناهێنێت..!!

یەکێك لەوانـە بـۆ فێربـوونی وانەیـەك چـووە خزمـەت مامۆسـتایەك و، پێـنج سـاڵ لـە لایـدا مایـەوە، پاشـان ئـەوی جێهێشـت و چـووە لای مامۆستایەکی تر، مامۆسـتاکەی تـووڕە بـوو و پێـی گـوت: ئـاخر بۆچـی جێت هێشتم.. باشە تۆ هێشتا تەواوی زانستەکەمت وەرگرتـووە تـاوەکو واز لە من بهێنیت و بچیتە خزمەت مامۆستایەکی دیکە..؟؟

وتی: نە بەخوا تەواوی زانست و زانیارییەکەتم وەرنەگرتووە، بەڵام من بۆ ماوەی پێنج ساڵی تەواو لای تۆ مامەوە و هەموو ڕۆژێك پێت دەگوتم: فڵانە کەس گوتی، فڵانە کەس گوتی.. دەمویست بزانم تۆ چی دەڵێیـت، بەڵام بە داخەوە تۆ هیچت نەگوت..!!

وەرگـرتن و کۆکردنـەوەی زانیـاری بـەبێ ڕۆڵبینینـی ئـەقڵ تێیـدا، جارجـارە گومـان لەسـەر ڕاسـتیی زانیارییـەکان دروسـتدەکات بـەهۆی دژیەکییانـەوە.. هـەر بۆیـە پێویسـت دەکـات بـە شـێوەیەکی دروسـت فێرببین..

بنەمایەکی جوان لەم بارەیەوە هەیە، دەڵێت: تۆ ناتوانیت لە زانستێك بگـەیت تـا لـە مێژووەکـەی نەگـەیت.. هەرچـی زانسـتی دونیـاش هەیـە، تاوەکو بـە تـەواوی لێـی تێبگـەیت و فێـری بیـت پێویستە لەسـەرت لـە مێژووەکەی تێبگەیت، چۆن پەیدا بوو، ئەو کەسانە کێ بوون کە ڕۆڵیـان گێڕا لە پێشخستنیدا و، پێویستە ئەو گۆڕانکارییانەش بزانیت کە بەسـەر ئـەو زانسـتەدا هـاتوون.. ئەوسـا بـیر و بۆچـوونی ئـەقڵی خـۆتی تێـدا دەربڕیت.. بۆ نموونە بڵێیت:

ئەم بۆچوونە فڵانە کەس وتی، بەڵام ڕاست نییە.

ئەمە بۆچوون و بیرۆکەیەکە، فلان کەس باسیکردووە و، باشترین بیرۆکەیە بۆ ئەم بابەتە.

ئەمە بۆچوون و بیرۆکەی فلانە کەسە، بەلام مرۆڤی ژیر قسەی وا ناکات..

گەر بشگەڕێیتەوە بۆ هەرچی زانست هەیە دەبینیت پڕیەتی لە شتی پڕوپووچ و درۆ و دەلەسە، کە خەلکی دەماودەم لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەیگێڕنەوە..

جارێکیان سەردانی دوو زانستخوازم کرد، بینیم خەریکی خوێندنەوە و مشتومڕن لەسەر کتێبێك، بابەتەکەش دەربارەی ئاوی بەر هەتاو بوو، ئاخۆ دەستنوێژگرتن بەو ئاوە دروستە یان نا..؟

یەك کاتژمێری تەواویان بەو باسەوە کوشت، لە ماوەی ئەو کاتژمێرەدا هەر بە وتیان و دەلێن هێنایان و بردیان.. لە کۆتاییشدا یەکێکیان وتی: ئەمە بابەتێکی پزیشکییە و ئەگەر پزیشك وتی نابێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشی بەلەکی، ئەوە ئاساییە.. منیش پێم وت: دە هەر لەسەرەتاوە بۆ نالێیت ئەمە بابەتێکی پزیشکییە، باشتریش وایە ئەو بابەتەی کە هیچی لەبارەوە نازانیت، کاتژمێرێك خۆتی پێوە خەریك نەکەیت و کاتی خۆت و خەلکیشی پێوە نەکوژیت.. من خۆم لە ژیانمدا خەلکانێکی زۆرم بەرچاو کەوتووە کە لە ڕۆژانی سەرما و سۆلەدا ئاویان لەبەر خۆردا داناوە تاکو شلەتێن بێت، ئینجا دەستنوێژیان پێگرتووە.. ڕۆژێك لە ڕۆژان هیچ کامێکیشیانم نەبینی نەخۆشی بەلەکی بگرێت، ئەوەش شتێکە زانستی پزیشکی بەدرۆی خستووەتەوە..

بۆیە خەڵکانێکی زۆر هەن کە زانا و شارەزان بەڵام ئەقڵیان لەو زانست و زانیارییەی هەیانە ناخەنە کار.. وتراویشە: یەك درهەم پارە پێویستی بە عەیارێك ئەقڵ هەیە. منیش دەڵێم:

درهەمێك زانست پێویستی بە دوو عەیار عەقڵ هەیە.

زانست پێویستی بە بیرکردنەوە و ئەقڵ هەیە؛ تاوەکو لە ژیانماندا بەکاری بهێنین، ئاخر پێم ناڵێیت زانیاری زۆر و بۆر چ سوودێکی هەیە، زانستێك کە لە خوای گەورە نزیکمان نەخاتەوە و، باری ژیانمان بەرەو باشی نەگۆڕێت چ کەڵکێکی هەیە..؟؟

ئێمە خۆ خاوەنی باشترین بیردۆزی ئابوورین لە جیهاندا، بەڵام بۆچی زۆربەی موسوڵمانان هەژار و نەدارن، ئاوارە و دەربەدەر و سەرگەردانن..؟ بۆچی ئەمەمان بەسەردا دێت.؟ لە یەکتریی بپرسن.. ئیتر با قسەی زل بەس بێت.. با بیرێك بکەینەوە و ورد ببینەوە و هەڵوێست وەربگرین.

# هاوسەنگیی
## لە نێوان بازنەی گرنگیپێدان و بازنەی کارتێکردندا



پێم وایە کەسی زیر و کارا و پێگەیشتوو ٨٠٪ ئەگەر نەڵێم ٩٠٪ی هەوڵ و بیرکردنەوە و کار و کاتی خۆی بۆ بازنەی کارتێکردن تەرخان دەکات و، تەنها ١٠٪ – ١٥٪ ئەوپەڕەکەی٢٠٪یشی بۆ بازنەی گرنگیپێدان تەرخان دەکات..

با بزانین جیاوازی چییە لە نێوان بازنەی کارتێکردن و گرنگیپێداندا..؟

ئەم نموونەیە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە دەهێنمەوە.. من بایەخ بە ڕەوشی موسوڵمانان لە ئیندۆنیزیا دەدەم و، بایەخ بە ڕەوشی ئامۆژگاری ئایینی دەدەم لەوێ و، ئێمەش گرنگی پێدەدەین و، لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیشماندا گرنگی بە شەڕی ناوخۆیی لە سۆماڵ و بەو

ماڵوێرانییەی کە لەوێ هەیە دەدەین، هەروەها گرنگی بە کێشەی فەڵەستین دەدەین.. ئەمە بازنەی گرنگیپێدانی پێدەڵێن.

بەڵام بازنەی کارتێکردن ئەو بازنەیەیە کە هەوڵدانی خۆمی تێدا دەخەمەگەڕ تا دەرەنجامی دیاریکراوی لێ بەدەست بهێنم، بازنەکانی کارتێکردنیش زۆرن و، بە ڕووی یەکدا کراوەن و، چەقی بازنەی کارتێکردنیش منم.. دەڵێم: من ئێستا نامەوێت بۆ ماوەی کاتژمێرێك ئاو بخۆمەوە. دەی من دەتوانم ئەو کارە بکەم.

پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان دەرەنجامەکە و ئیرادەدا هەیە و، بازنەیەکی کارتێکردنی نزیکتر لە ئارادایە کە ئەویش بازنەی خانەوادەیە و، بازنەیەکی کەمێك دوورتر هەیە کە خزم و کەس و کارە و، پاشان بازنەی شار و، دواتر بازنەی وڵات...

بۆیە کەسی ژیر و تێگەیشتوو و هۆشمەند زۆربەی هەوڵ و تواناکانی خۆی لە بازنەی کارتێکردندا دەخاتەگەڕ؛ چونکە وەبەرهێنان و دەستکەوتی زیاتر لە بازنەی کارتێکردندا بەدەست دێت، هەندێ کاتیشی بۆ بازنەی گرنگیپێدان تەرخان دەکات.

کەسانێکی زۆر هەن کاتێکی هێجگار زۆر بۆ بازنەکانی کارتێکردن تەرخان دەکەن و، لە تەنها دانیشتنێکدا سەرتاسەری جیهان بەسەر دەکەنەوە، بەڵام کە تەماشای بازنەی دووەمی کارتێکردنیان دەکەیت کە ژینگە و دەوروبەرەکەیانە هەر بەتەواوی گوێی خۆیان لێ خەواندووە..!!

ئاخر چۆن دەبێت خۆت بە چەندین شتی بێسوودەوە سەرقاڵ بکەیت و، چەندین بازنەی کارتێکردنی تر پشتگوێ بخەیت کە دەتوانیت ڕۆڵی باشیان تێدا بگێڕیت..!! لە لایەکی دیکەوە گەلێك موسوڵمانی تر هەن تەواوی ژیانیان بۆ بایەخدان بە بازنەکانی کارتێکردن تەرخان کردووە بەبێ ئەوەی خێرێکیان هەبێت بۆ بازنەی گرنگیپێدان..!! من خۆم خەڵکانێك دەناسم سەرقاڵی کاری پەروەردەن، هەندێکیشیان سەرگەرمی لەبەرکردنی قورئانن و فێرخوازی زانستی شەرعین، بەڵام لە بازنەکانی کارتێکردندا وەك ئەوەی بایەخ بە بارودۆخی موسوڵمانان بدات، یان بایەخ بە ئاینده بدات، یان گرنگی بە چارەسەرکردنی کێشەکان بدات و ڕەوشەکە بگۆڕێت.. بەداخەوە ڕۆڵ نابینێت و هەرگیز شتی لەو جۆرەی لێ نەوەشاوەتەوە، ئەم کەسە کاتێك کە چاوت پێی دەکەوێت وێنەیەکی ڕەشبینانەت دەربارەی ئاینده و ئاسۆی ژیان پێشکەش دەکات؛ چونکە خۆی لە بوارێکی تەسکی کارکردندا قەتیس کردووە..!!

ئێمە ئەی خوشك و برای خۆشەویستم هاوسەنگیمان دەوێت، بەڵکو دەربڕینە جوان و پەسەندکراوەکەم دەوێت **دووپاتکردنەوەی هاوسەنگی**، جا ئەوانەی کە سەرقاڵی بازنەکانی گرنگیپێدانن و بازنەکانی کارتێکردنیان پشتگوێخستووە ، پێویست دەکات بگەڕێنەوە بۆ بازنەکانی کارتێکردن و، کات و توانای پێویستی بۆ تەرخان بکەن، ئەوانەشی کە نە لە نزیك و نە لە دوورەوە ئاگایان لەوە نییە کە چی لە دەوروبەریاندا دەگوزەرێت، پێویستە لەسەریان کەمێك لە بازنەی کاتێکردنەوە بێنە دەرەوە و بچنە بازنەی گرنگیپێدانەوە..

# هاوسەنگی
## لە تێڕوانینماندا بۆ شتەکان



هاوسەنگیش لە تێڕوانینماندا بۆ شتەکان جۆرێکی دیکەی هاوسەنگییە، جا کاتێك کە چاومان بە ژمارەیەك گەنج، یان بە ژمارەیەك مامۆستا، یان بە ژمارەیەك زانا، یان بە ژمارەیەك بیرمەند، یان بە ژمارەیەك کەسی ئاسایی دەکەوێت... دەستبەجێ باسی دونیایەك کێشە و گرفتمان بۆ دەکات، هەر دەڵێیت بانکێکی زانیارییە لەسەر کێشەکان.. جا ئەو کەسە ئەگەر مامۆستا بێت قسە و باسەکانی دەربارەی کەمتەرخەمیی مامۆستایان و قوتابیان و، خراپ مامەڵەکردنی ستافی کارگێڕییە لەگەڵیدا.. ئەگەر کارمەندێکی کۆمپانیایەکیش بێت سەیر دەکەیت دەربارەی خراپی ستافی کارگێڕیی و شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە دەدوێت.. هەر خەریکی باسکردنی کێشەکانە..!! بۆیە کاتێك دێیتە دەرەوە سەرت گێژ دەخوات و دونیات لەبەر چاو تاریك دەبێت..

سەرنجی ئەوەشم داوە کە منداڵە بچووکەکانیش لە گەورەکانەوە فێری هەمان خوو دەبن، بۆیە ئەو جۆرە کەسانە منداڵەکانیان چوونەتەوە سەر خۆیان؛ چونکە هەر کە چاو بە دونیا هەڵدێنن لە کێشە و گرفت بەو لاوە گوێیان لە هیچ نابێت.. بۆیە منداڵی ئەو جۆرە کەسانە هەڵدەستێت بە تەواوکردنی ئەو بیرۆکانەی کە باوکی بۆی تەواو نەکراون، یان بیرۆکەیەکی تر بۆ پاڵپشتیکردنی بیرۆکەکانی باوکی دێنێت، بۆیە دەبینیت لە کۆڕ و دانیشتنەکانیاندا باس هەر باسی کێشەکانە.

بەشێکی دیکەی پێچەوانەی ئەم تێگەیشتنە هەیە، هەمیشە دەڵێت: ئێمە شوکر باشین و، ئوممەتی ئیسلامیش شوکر باشە و، فلانە کەس پێنج کەس لەسەر دەستی موسوڵمان بوون و، فلانە ڕێکخراو سەد فەردە ئاردی دابەشکرد.

ڕاستە ئەو کارانە شتانێکی باشن، بەڵام تۆ بێیت بڵێیت:"ئوممەتی ئیسلام هیچ کێشەیەکی نییە.." ئەمەیان دوورە لە ڕاستییەوە.. چەندین نەخۆشمان هەن کە بەبێ دەرمان سەردەنێنەوە و، چەندین هەژاریشمان هەن کە بەبێ شێو سەردەنێنەوە و، چەندین خوێندکاریش هەن کە خوێندنگایان دەست ناکەوێت و، وڵاتانێکی زۆریش هەن شەڕی ناوخۆیان تێدا هەڵگیرساوە و، چەندین گرتووخانە هەن کە جمەیان دێ لە تاوانباران و، خەڵکانێکی زۆر ئالوودەی مادە بێهۆشکەرەکان بوون و، چەندین کێشەی دیکە..

بۆیە ئێمە پێویستمان بەوەیە کە لەو شتانەشدا هاوسەنگی ڕابگرین، من بۆ خۆم زۆر پەست دەبم کاتێك چاوم بە کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی یەك یان دوو کاتژمێری دەکەوێت و هەر باسی کێشە و بەزم و ڕەزمی دونیای تێدا دەکرێت، یان تەنها باسی سەرکەوتنەکان و ئازادکردنی وڵاتانی تێدا دەکرێت..!!

نە ئەوە ڕاستە و نە ئەمەش ڕاستە..

بۆیە پێویستە هەمیشە هەر تەنها باسی نیوە پڕەکەی پەرداخەکە نەکەیت تا خەڵکی بەوە هەڵنەخەڵەتێن کە پەرداخەکە پڕە، کە لە ڕاستیدا نیوەی پڕە، هەروەها تەنها باسی کێشە و مەینەتی مەکە..

تەنها باسکردنی کێشە و گرفتەکان شتێکی نادروستە، دیسان باسکردنی خاڵە ئەرێنیەکانیش بە تەنها هەر نادروستە.

پێم وایە ئەو جۆرە گشتاندنە لە قسەکردندا هۆی دروستبوونی کێشەکەیە و، بۆ ئەوەی قسەکانمان ئاکامی باش بدەن بەدەستەوە پێم باشە ئەوەندەی بۆمان بکرێت هەر بوارێك بۆ بچووکترین یەکە دابەش بکەین..

بۆیە کاتێك لەبارەی فێرکردن و فێرکارییەوە دەدوێین.. پێویستە بپرسین: کێشەکانی فێرکردنی ئێمە چین..؟؟ ئەی خاڵە بەهێزەکانی پرۆسەی فێرکردنمان چین..؟؟

تۆش ناتوانیت بڕیار بەسەر تەواوی جیهاندا بدەیت، چونکە تۆ تەنها بەشێکی بچووکی ئەم جیهانە دەبینیت و، دەتوانیت بڕیار لەسەر قوتابخانەکەت بدەیت و، ڕەنگە تا ڕاددەیەك قسەکانت ڕاست بن..

بۆیە پێویستە تا دەکرێت بابەتەکە دابەش بکرێت بۆ بچووکترین بەش، لەگەڵ باسکردنی لایەنە باش و خراپەکانی..

بۆ نموونە: **بابەتی جیهانگەرایی یان بەجیهانیبوون (العولمة)** نووسەرێکی زۆری موسوڵمان و ناموسوڵمان لەبارەی بەجیهانیبوونەوە بابەتیان نووسیوە، وا بزانم سەدان کتێبیش لەم بارەیەوە نووسراون.. ژمارەیەك لەو نووسەرانەی کە دەربارەی جیهانگەرایی بابەتیان نووسیوە، جیهانگەراییان وەك گەورەترین بەڵا و موسیبەت بە خەڵکی ناساندووە و، بە گەورەترین پیلانی نێودەوڵەتی و جیهانیی لە قەڵەمیان داوە کە لەم سەردەمەدا دژی جیهانی ئیسلامی داڕێژرابێت و، چەندین بەڵگەشمان بۆ دەهێننەوە..

لەبەرامبەریشدا ڕەوتێکی تر هەیە و، زۆربەی هەوادارانی ئەم ڕەوتەش لە نائیسلامییەکانن، جیهانگەراییمان وەها بۆ وێنا دەکەن کە هەل و فرسەتی تەمەنە؛ با لە کۆت و بەندی داب و نەریت و کێشە و گرفت و دواکەوتووییمان ڕزگارمان بێت و، بەڕووی جیهاندا بکرێینەوە و، لە خێر و بێر و خۆشی ئەوروپا و ئەمەریکا خۆمان بێبەش نەکەین، گەر بێتو ئەم هەلە لە دەست خۆمان بدەین ئیدی هەلێکی دیکەمان بۆ هەڵناکەوێتەوە.. هەر بەوەشەوە ناوەستێت.. دونیایەك بەڵگەمان بۆ دەهێننەوە و، ڕاپۆرتێکی دوور و درێژیشمان لەو بارەیەوە بۆ دەخوێننەوە... نە ئەوە ڕاستە و نە ئەمەش ڕاستە...

بەجیهانیبوون دەلاقەیەك نییە بەڕووی خۆشی و ڕابواردندا و، ڕێگەیەك نییە بۆ خۆشگوزەرانی و، ڕێگەیەك نییە بۆ گۆڕینی ژیانی

خەڵکی بەرەو باشتر.. دیسان بەجیهانیبوون گەورەترین کێشە و گرفت و بەڵای ناگەهان نییە..

بەجیهانیبوون قەیران و هەل پێکەوە کۆدەکاتەوە، سوودیشی تێدایە و زیانیشی تێدایە، پێم وایە زیانەکانی زۆرترن لە سوودەکانی..

هەندێ کەس وەها باسی جیهانگەراییت بۆ دەکات کە دەسیسەی ئەمەریکایە، ئەوەش دوورە لە ڕاستییەوە، هەندێکی تریان دەڵێن ئەمە پیلانێکی جیهانییە، ئەوەش دیسان ڕاست نییە..

جیهانگەرایی بێ سەرپەرشتە، کەسانێك هەن لەبەر بەرژەوەندی خۆیان هەوڵی بڵاوکردنەوەی جیهانگەرایی دەدەن، ئەوانەشی کە بەرژەوەندییان لە جیهانگەراییدایە هاریکار و هەماهەنگ نین و، لەسەر بنەماکانی بازاڕ یاری دەکەن و، پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی کێبڕکێیە، نەك پەیوەندیی هاریکاریی؛ لەبەر ئەوە جیهانگەرایی بێ ڕێکخستن و بێ سەرپەرشتە. بەڵام جیهانگەرایی بەو پێیەی هەوڵ بۆ هێنانەدی دەستکەوتی ئابووری گەورە دەدات و، دەیەوێت گۆڕانکاریی ڕیشەیی کەلتووریی گەورەش لە نێو خەڵکیدا بەرپا بکات، بێگومان ئەو گۆڕانکارییە کەلتوورییانەش زیانی گەورەمان پێدەگەیەنن.

کەوابوو: پێویستە دیدگایەکی ڕوون و هاوسەنگمان بۆ لایەنە باش و خراپەکان هەبێت، چونکە خێر و چاکەی بێ خەوش دەگمەنە و، شەڕ و خراپەی بێ خەوشیش هەر دەگمەنە، زانایانیشمان فەرموویانە: خوای گەورە خێر و چاکەی بێ خەوشی بەدی نەهێناوە بێجگە لە بەهەشت و، شەڕ و خراپەی بێ خەوشیشی بەدی نەهێناوە بێجگە لە دۆزەخ.

# هاوسەنگیکردن
## لە نێوان ڕابردوو و داهاتوودا



ئەوەی بووەتە جێی سەرنج ئەوەیە کە زۆر جار کاتەکانمان بە بەسەرهاتی کۆن و ڕابردووەوە دەکوژین، دانیشتنی دووردرێژی وا هەبووە پرسیارمان تێدا کردووە و وتوومانە: ئایا فلانە کەس لەسەر هەق بوو، یان فیسارە کەس..؟ ئەی ئەو دەوڵەتە بۆچی ڕووخا..؟؟ هەر یەکەمان لە خۆوە قسەیەك دەکەین..

یەکێك دەڵێت: دەوڵەتی عوسمانی بۆیە کەوت و ڕووخا؛ چونکە گەندەڵیی زۆری تێدا بوو. کەچی یەکێکی تر ڕاست دەبێتەوە و دەڵێت: بەڵکو بەهۆی پیلانگێڕییەوە ڕووخا..

نە ئەم کتێبێکی دەربارەی مێژووی دەوڵەتی عوسمانی خوێندووەتەوە و نە ئەویش خوێندوویەتیەوە، هەمووی قسەی گومانلوی و بۆچوونی بێ بنەمایە و لە ئەنجامی نەشارەزاییەوە دروست دەبێت.

بۆیە زۆر کەس بە مانای وشە دیلی ڕابردووە و، خوێندنەوەی هەڵیت و پەڵیت بۆ ڕابردوو دەکات، چونکە ئەو ئامرازانەی لەبەر دەستدا نییە کە خوێندنەوەیەکی ڕاست و دروستی بۆ مێژوو پێبکات..

کاشکی بەرنامە و پەیامی قورئانمان پەیڕەو دەکرد، کە بە دەگمەن نەبێت خۆی لە قەرەی وردەکارییەکان نادات و، ناوی زۆر شتت بۆ باس ناکات و، ئاماژە بە مێژووگەلێکی دیاریکراو ناکات؛ چونکە مەبەستی سەرەکی لە باسکردنی مێژوو پەند و وانە وەرگرتنە، تاوەکو ئاشنای خاڵە بەهێزەکانی گەلانی جیهان ببیت و سوودیان لێوەربگریت، هاوکات ئاشنای هەڵە و کەموکوڕی و خاڵە لاوازەکانیان ببیت و خۆتیان لێبپارێزیت.. ئەمەیە پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن.

مێژوو بۆ پەند و ئامۆژگاری پەنای بۆ دەبرێت، نەك بۆ ئەوەی بیکەینە فاکتەری کەرتبوون و دژایەتیکردنی یەکتری، کە لە ڕاستیدا ئەمڕۆکە مێژوو لەناو ئوممەتی ئیسلامدا فاکتەری کەرتبوون و دژایەتی یەکترییە، بۆیە زۆر جار خەڵك دەربارەی بابەتێکی مێژوویی ناکۆکییان تێدەکەوێت لە کاتێکدا ئەو بابەتە بەسەرچووە و هەرگیز ناگەڕێتەوە و دووبارە نابێتەوە.

کەوابوو دەبێت پەند و ئامۆژگاری لە ڕابردوو وەربگرین و، لە وردەکارییەکانی دووربکەوینەوە، چونکە تا زیاتر بە نێو وردەکارییەکانی بابەتی مێژووییدا قووڵبیتەوە گومان و دوودڵیمان بۆ دروست دەبێت، ئەوسا پشت بە بۆچوون و لێکدانەوەکانی مێژوونووسەکە دەبەستین.. وای لێدێت دەمی ئێستا پشتگوێ دەخەین.. دەی ئاشکرایە دەمی

(ئێستا) ئەوەیە کە چۆن کاروباری ژیانمان بەڕێوەدەبەین..؟؟ چۆن سوود لە مێژوو وەردەگرین و لە خزمەتی ئێستاماندا دەیخەینەگەڕ..؟؟ چۆن سوود لە ڕابردوو وەردەگرین بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئێستامان..؟؟

ئەمە پرسیارەکەیە و ئەمە کێبڕکێکەیە.

لەبەر ئەوە دەبێت ٢٠٪ی کات و هەوڵەکانمان بۆ مێژوو تەرخان بکەین و، پاشماوەکەی بۆ ئێستا تەرخان بکەین.

ئێمە ناتوانین لە هەنووکە تێبگەین؛ چونکە هەنووکە وەکو هێلم و جەلاتین وایە لەناو دەستدا خۆی ناگرێت، جا ئەگەر نەتوانین لە هەنووکە بگەین، ئیدی چۆن لە مێژوو دەگەین..؟

من ناڵێم: پێویستە مێژوو نەخوێنینەوە، بەڵکو دەبێت مێژوو بخوێنینەوە و، بەشێوازی گونجاو لێی تێبگەین ، بەو مەرجەی کە ڕابردوو کاتەکانی دیکەمان لەبیر نەباتەوە: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ البقرة: ١٣٤

(ئەوانە ئوممەتێ بوون ڕابووردن. کەسبی خێری خۆیان بۆ خۆیانەو ئێوەش کەسبی خێری خۆتان بۆ خۆتانە، کەس لە بەشی کەس نابات و کەس حەقی بەسەر کەسەوە نییەو ئێوە بە تاوانی ئەوان تاوانبار ناکرێن هەروەك بە چاکەیشیان پاداشتان نادرێتەوە.)

# پێڕست

# التوازن في حياة المسلم




• ئەو کەسەی ئامانجی ڕوون و دیاریکراوی نییە کەسێکی خەسارەتمەندە..

• هەر سەرکەوتنێك لەم دونیا فانییەدا خزمەت بە سەرکەوتن و سەرفرازیی ئەو دونیای هەتاهەتایی نەکات، سەرکەوتنێکی کاتییە و دەبڕێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەشێوازی ڕەواش بەدەست هاتبێت.. هەر سەرکەوتنێکیش بە ڕێگە و شێوازی نارەوا بەدەست بێت خەیاڵە و دەڕەوێتەوە..

• هاوسەنگی ئەوەیە سەرکەوتنێك بهێنینە کایەوە کە لە خوامان نزیك بکاتەوە..

• پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئەم پرسیارە بەهەند وەربگرێت: "ئایا من کەسێکی هاوسەنگم..؟"

0-0310-0000-2



9 780031 000002

نرخی (۲۰۰۰) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
www.aramediacenter.com
info@aramediacenter.com

